# ڕاهێنانی مێشك ( تدريبات زاكيرة )

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

پێغەمبەر ( درودی خودای لەسەربێت ) دەفەرموێت ( بەهاوڕێی قورئان دەوترێت بخوێنە وەك چۆن لە دونیا ئەتخوێندەوە ، بخوێنەو بەرزبووەوە جێگای تۆ لە کۆتا ئایەتە کە ئەیخوێنیتەوە )

شەش ئامۆژگاری بۆ لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز

1-نیەت : بانیەتت تەنها بۆ خودابێت . بۆ خۆدەرخستن و ناوبانگیت نەبێت .

2- نزاکردن ( دوعاکردن ) لەهەموو نوێژێکدا نزابکەو بڵێ خودایە لەبەرکرنی قورئانم بۆ ئاسان بکە . زاکیرەم بەهێزبکە ، لەبیرچوونەوەم لەسەرلادە . ( سَنُقۡرِئُكَ فَلَا تَنسَىٰٓ ٦ إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُ ) سورة الأعلىٰ .

3- ساردنەبوونەوە و خۆ نەچواندن بەکەسانی تر : ساردمەبەوە لەبەرکردن و مەڵێ فلان کەس زیرەکەو بە ماوەیەکی کەم بووە بە حافظ قورئان ، کەسەکان جیاوازن لەتوانای لەبەرکردندا هەیە بە مانگێك و هەیە بە شەش مانگ و هەیە بە ساڵ و هەشـ سێ ساڵ و زیاتر ئەبێتە لەبەرکاری قورئان ، دڵنیابە تۆ یەکێکی لەو کەسانە بەردەوامەبە و کۆڵ مەدەو پشت بە خودا ببەستە دەبـ لەبەرکاری قورئان .

4- سوپاسکردنی الله : هەمیشە سوپاسگوزاری خودابە کە ئەو فەزڵەی پێداویت ببیتە لەبەرکاری قورئان . الله دەفەرموێت ( لَئِن شَكَرۡتُمۡ لَأَزِيدَنَّكُمۡ ) سورة ابراهيم 7

5- ڕێکخستنی کات : ڕێکخستنی کات زۆرگرنگە ، پێویستە خشتەی کاتت هەبێت بۆ لەبەرکردن باشترین کات بۆلەبەرکردن کاتـ بەیانیانە ، کاتی ئێواران و لەناو نوێژەکان بۆ مراجعە باشە .

6- هەوڵدان و توانادان بە خۆت وە ئەنجامدانی ئەو ڕاهێنانانەی کە باسی دەکەین ، وە گرنگی دان بەڕاهێنانەکان و جێبەجێکردنـ .

## چەند نموونەیەك لە سەر هاوەڵان و زانایان

1-ئیمامی شافعی ( ڕەحمەتی خودای لێبێت ) تەنها بەیەك سەیرکردن و خوێندنەوەی لاپەڕەکەی لەبەردەکرد ، بە نۆ ڕۆژ ( 3 هەزار ) فەرموودەی لەبەر کردووە

2- ئیمامی بوخاری ( ڕەحمەتی خودای لێبێت ) لەتەمەنی (16)ساڵی ( 70 ) هەزار فەرموودەی لەبەربوو ،

3- دۆمنیك زانای زاکیرە (50 ) ووشەی بەیەکجار بیستن لەبەردەکرد و تاکو دوومانگ لەیادی دەماوە

4- عکرمە قوتابی ابن عباس ( ڕەحهمەتی خودایان لێبێت ) بە دوو مانگ قورئانی حفظ کردووە

5- دایکە عائشە ( ڕەحمەتی خودای لێبێت ) بەیەك جاربەبیستن قورئانی حفظ کردووە ، ( 100 ) هەزار دێرە شعری لەبەربوو

6- أبو قتادە (( ڕەحمەتی خودای لێبێت ) بەیەکجار بیستن سورەتی بقرەی لەبەرکردووە

7- حجاجی کوڕی یوسفی سقفی هەموو قورئانی لەبەربووە وەتوانویەتی بەپێچەوانەشەوە بیڵێت هەرچەندە دروست نیە

8- عبالرحمن کوڕی عوف ، ئیمامی شافعی ، ئیمامی أحمد ، ابوحنیفە ، شیخ ابن باز ئەمانە لەیەك رکعات خەتمیان کردووە

## ئەوشتانەی
## زاکیرە بەهێز دەکەن

1-بەچاو خوێندنەوە کە لە ڕاهێنانەکاندا هەیە زۆربەسوودە بۆ بەهێزی زاکیرە و چاو

2- زۆر ئاو خواردنەوە کە دەبێتە هۆی تەڕبونی دەمارەکانی مێشك ڕۆژانە ( 10 بۆ 12 ) پەرداخ ئاو بخۆرەوە .

3- شناوکردن و ڕێکردن بەپێ بۆماوەی 20 خولەك ڕۆژانە زۆربەسوودە

4- خواردنی ( مێوژ ، خورما ، هەنگوین ، ماسی ، چەرەزات ، شیر ، گوێز )

5 – هەناسەدانی سروشتی کە ڕۆژانە چەند جارێك ئەنجامی بدە بەم شێوەیە

هەڵمژینی هەناسەی زۆر بەلووت پاشان ڕاگرتنی بۆ ماوەی 5 چرکە ، پاشان دانەوەی هەناسەکە بە دەمت و لەسەرخۆی ئەم ڕێگایە ئۆکسجینی باش دەگاتە مێشکت .

6- سەرینی بەرز بەکار مەهێنە ، هەرکات زۆربەپێ ڕێتکرد یان بەپێوە وەستای ، باشترە دواتر ڕاکشێیت و قاچەکانت بخەیتە سەر شتێکی بەرز بۆئەوەی لەئاستی سەرت زۆربەرزتربێت تاکو خوێنی باش بگاتە مێشکت چونکە مێشك پێویستی بە ( 20% ) خوێن

ئەو شتانەی زاکیرە لاواز دەکەن

1-کەم خەوی پێویستە مرۆڤ لە شەوڕۆژێك ( 7 بۆ 8 ) سعات بخەوێت ، باشترە شەو زوو بخەوێت ، وە چێشتەنگاخەو زۆر بەسوودە .

2- زۆر خواردن

3- نەخواردنی خۆراکی بەسوود و کەم ئاو خواردن

4- زۆر دانیشتن ، یەك سعات دانیشتن بەبەرامبەر بە کێشانی جگەرەیەکە

5- توڕەبوونی زۆر ، یەك سعات توڕەبوون ( 70 ) هەزار خانەی مێش دەسڕێتەوە

6- نەخۆشیە درێژخایەنەکان .ز

7- غودەی دەرەقی

8- کەمی ئاسن و ڤیتامینەکان بەتایبەتی ( بی 6 ، بی 12 ، کەمی ڤیتامین دی )

9- زۆر شیرینی خواردن باش نیە .

ڕوونکردنەوە لە سەر خاڵەکانی ڕاهێنانی زاکیرە

1-گوێگرتن لە قورئان : واتە ڕۆژانە گوێ لە قورئانی پیرۆز بگرە بەپێی خشتەی ڕاهێنانەکە ، أحمد بن محمد دیبان باشترینەو بە (12خولەك ) یەك جزء دەخوێنێتەوە ..

2- خێرا خوێندنەوە : واتە بەچاو سەیری ئایەتەکان بکە نەبەدەنگ بیخوێنەوەو نە بەدڵیش بیخوێنەوە ، تەنها واسەیری بکە وەك شتێك بداتە پێش چاوت ، ئەمەش بۆ لەبەرکردن سوودی زۆرە وا لەمێشك دەکات ئەوەندە رەسمی ئایەتەکان بگرێت لەکاتی لەبەرکردن بەلای مێشکەوە ئاسانبێت ، هەفتەی یەکەم ڕۆژانە 25 لاپەڕە تەماشا بکە ، دێڕ دێڕ تەماشای بکە

هەفتەی دووەم ڕۆژانە 50 لاپەڕە دوو دێڕ پێکەوە تەماشا بکە ، هەفتەی سێیەم 100 لاپەڕە سێ دێر پێکەوە تەماشا بکە هەفتەی چوارەم 200 لاپەڕە پێنج دێڕ پێکەوە تەماشا بکە ، هەفتەی پێنجەم 300 لاپەڕە (10) دێر پێکەوە تەماشا بکە ، هەفتەی شەشەم 400 لاپەڕە یەك پەڕە بەیەکجار تەماشابکە .هەتەی حەوتەم +هەشتەم خەتمی تەواو بکە .

3- لەبەرکرنی بینین ( حفظ بصری ) واتە بەدڵ بیخوێنەوەو هەوڵی لەبەرکرنی لاپەڕەیەك . وە حفظ سمعی واتە لەبەرکردن بەبیستن ئەمانەش بەپێی خشتەکە بڕۆ

4- سەیرکردنی ڤیدۆ لە یوتوب کە تایبەتە بە خێراکرنەوەی چاو ، کە زۆر بەسوودە بۆ بەهێزی چاو زۆر کەس بەسەیرکردنی ئە ڤیدۆیانە چاوایان تائاستێکی باش بەهێز بووە .

5- ژماردنی ژمارە بەپێچەوانەوە بەنموونە ( 100 ، 99 ، 98 ، 97 ، 96 ...... ) یان ( 100 ، 98 ، 96 ،94 .....) هەفتەی یەکەم ڕۆژانە لە ( 100 بۆ 0 ) یەك یەك بێرە خوارێ پاشان دوو دوو بێرە خوارێ پاشان سێ سێ پاشان چوارچو ،پێنج پێنج ، شەش شەش ، حەوت حەوت ، هەشت هەشت ، نۆ نۆ ،

هەفتەی دووەم +سێیەم( 200 بۆ 0 ) فەفتەی چوارەم+پێنجەم ( 300 بۆ 0 ) هەفتەی شەشەم حەوتەم( 400بۆ 0 ) هەفتەی هەشتەم ( 500 بۆ 0 )

6- نووسین بە دەستی ڕاست و چەپ واتە ( 5 ) ووشە بە دەستی ڕاست بنووسە پاشان بەپێچەوانەوە ، پاشان بە دەستی چەپ بینووسە پاشان بە پێچەوانەوە ، پاشان بە هەردوو دەستت بە ڕاستەوانەو پێچەوانەش بینوسە هەردوو دەستت بەیەکەوە بابنوسێ

7- خوێندنەوەی ووشە بەپێچەوانەوە وەك ( مێشك ، کشێم ) بەڵام ووریابە قورئان و حدیث و بابەتە ئاینیەکان بەپێچەوانەوە مەخوێنەوە .

8- دروستکردنی چیرۆك واتە ڕۆژانە ( 15 بۆ 20 ) ووشە بکە بەچیرۆکی خەیاڵی و دوورلە ڕاستی وەك چۆن ئەڵێت فلمی هندی بۆنموونە : لە قورئانی پیرۆز لە (14 ) سورەت (15) جارسوجدە هاتوە ، ئەتوانی بەشێوەی چیرۆك لەبەری بکەی بەم شێوەی

نافرەتێك بەناوی ( **أعراف** ) شوو بە پیاوێك دەکات بەناوی ( **رعد** ) کە لەهۆزی ( **نحل** ) دەبێت ، دووکچیان دەبێت بەناوەکانی ( **أسراء و مریم** ) بەڵام کوڕیان نابێت ، بۆیە بڕیار دەدەن بچن بۆ ( **حج** ) بۆنزاکردن تاکو خودا کوڕیان پێببەخشێت ، پاشان ،

بۆ ساڵی داهاتوو هەم دەچنەوە بۆ ( **حج** ) دواتر کوڕێکیان دەبێت ناوی دەنێن ( **فرقان** ) ئەم کوڕە لەکاتی یاریکردن ( **النملة** ) قاچی دەگەزێت ، بەخێرای دەیبەنەلای دکتۆرو چاك دەبێتەوە دایکوباوکەکەش ( **السجدة** ) ی شکور دەبەن بۆ خودا ، باوکەکە بۆ سبەی دەچێتە ( **ص** ) ی ڕاوەماسی و هەندێ ماسی دەهێنێتەوەو دایکەکەش ( **الفصلت** ) واتە بەشبەشی دەکات ، شەو لەسەربان دەخەون و منداڵەکان سەیری(**النجم** ) ئاسمان دەکەن ، پاشان پەڵەهەورێك دێت و ( **أنشقاق** ) چەخماخە لێدەدات جێگاکانیان دەسوتێت بەڵام سوپاس بۆ خودا خۆیان سەلامەت دەبن ، ئیتر دایك وباوکەکە دەست بەخوێندنی قورئان دەکەن و سەرەتا سورەتی **العلق** ) دەخوێنن .

هەموو ئەو ووشەی ناو کەوانەکان ناوی ئەو سورەتانەیە کە سوجدەی تێدایە .

**هەڵسەنگاندنی توانایی مێشکت وەتوانای لەبەرکردنت**

پێش دەستپێکردنی ڕاهێنانەکان ئەم هەڵسەنگاندنەیە بۆ توانای خۆت بکە ، تاکو دوای تەواوبوونی ڕاهێنانەکان ئاستی توانای بەرەوپێشچونی خۆت بزانیت .

| هەڵسەنگاندنی توانای مێشکت | ئەنجامەکەی بنووسە |
|---|---|
| 1-یەك لاپەڕەی 15 دێری لە سورەی بقرە بەچەند خولەك لەبەردەکەی ؟ بەبینین ( بصری ) | |
| 2- یەك لاپەڕەی دیکە بەچەند خولەك لەبەردەکەی لەسورەی بقرە بە بیستن ( سمعی ) ؟ | |
| 3- بۆ هەردێرێك بەجەند جار دووبارەکردنەوە لەبەرتکردووە بۆ بینین و بیستن . | |
| 4- کۆی لاپەڕەکە بەچەند جار دووبارەکردنەوە لەبەرتکردوە بەبینین و بەبیستن | |
| 5- لەماوەی (10 خولەك ) تەنها بەچاو سەیرکردن چەند لاپەڕەت تەماشاکردووە ؟ | |
| 5- تەنها بەیەکجار بیستن چەند ووشە لەبەردەکەیت ؟ | |
| 6- تەنها بەیەکجار بیستن چەند ژمارە لەبەردەکەیت ؟ | |

أبن قیم دەڵێ ابت تمیمە ئەم دوعایەیە زۆر دەکر بۆ بەباشی لەبەرکردنی بابەتێك

**( اللهم يا مُعلِمُ آدم َعلمنيِ ويا مُفَهِمَ سليمان فَهمنيِ )**

## خشتەی ڕاهێنانەکان

| حەفتە و ئاست | جۆری ڕاهێنان ( 4 کاتژمێر ) | شەممە | یەکشەممە | دووشەممە | سێشەممە | چوارشەممە | پێنج شەممە | هەینی |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| حەفتەی یەکەم / ئاستی یەکەم | گوێگرتن لە قورئان 5جزء قاری ( أحمد بن محمد دیبان ) | | | | | | | |
| | خوێندنەوە بە چاو ( 10خولەك ) 3 جار | | | | | | | |
| | سەیرکردنی ڤیدۆی خێرا خوێندنەوە 3 جار ) | | | | | | | |
| | حفظ بصری (15) دێر ( 90) خولەك لەحەفتەیەك 3 ڕۆژ | | | | | | | |
| | حفظ سمعی ( 5 )دێر ( 30 ) خولەك لە حەفتەیەك 4ڕۆژ | | | | | | | |
| | چیرۆکی خەیاڵی دروستبکە بە (10) ووشە | | | | | | | |
| | نووسین بەپێچەوانەوە | | | | | | | |
| حەفتەی دووەم / ئاستی دووەم | گوێگرتن لە قورئان 5جزء قاری ( أحمد بن محمد دیبان ) | | | | | | | |
| | خوێندنەوە بە چاو ( 10خولەك ) 3 جار | | | | | | | |
| | سەیرکردنی ڤیدۆی خێرا خوێندنەوە 3 جار ) | | | | | | | |
| | حفظ بصری (15) دێر ( 60 )خولەك لەحەفتەیەك 3 ڕۆژ | | | | | | | |
| | حفظ سمعی ( 10 )دێر ( 30 ) خولەك لە حەفتەیەك 4ڕۆژ | | | | | | | |
| | ژماردن بەپێچەوانەوە ( 100 بۆ سفر ) | | | | | | | |
| | خوێندنەوەی ووشە بەپێچەوانەوە ( 20 ووشە ) | | | | | | | |
| حەفتەی سێیەم / ئاستی سێیەم | گوێگرتن لە قورئان 5جزء قاری ( أحمد بن محمد دیبان ) | | | | | | | |
| | خوێندنەوە بە چاو ( 10خولەك ) 3 جار | | | | | | | |
| | سەیرکردنی ڤیدۆی خێرا خوێندنەوە 3 جار ) | | | | | | | |
| | حفظ بصری (15) دێر ( 40) خولەك لەحەفتەیەك 3 ڕۆژ | | | | | | | |
| | حفظ سمعی ( 12 )دێر ( 30 ) خولەك لە حەفتەیەك 4ڕۆژ | | | | | | | |
| | ژماردن بەپێچەوانەوە ( 200 بۆ سفر ) | | | | | | | |
| | خوێندنەوەی ووشە بەپێچەوانەوە ( 20 ووشە ) | | | | | | | |
| حەفتەی چوارەم / ئاستی چوارەم | گوێگرتن لە قورئان 5جزء قاری ( أحمد بن محمد دیبان ) | | | | | | | |
| | خوێندنەوە بە چاو ( 10خولەك ) 3 جار | | | | | | | |
| | سەیرکردنی ڤیدۆی خێرا خوێندنەوە 3 جار ) | | | | | | | |
| | حفظ بصری (15) دێر ( 30 خولەك لەحەفتەیەك 3 ڕۆژ | | | | | | | |
| | حفظ سمعی ( 15 )دێر ( 30 ) خولەك لە حەفتەیەك 4ڕۆژ | | | | | | | |
| | ژماردن بەپێچەوانەوە ( 300 بۆ سفر ) | | | | | | | |
| | خوێندنەوەی ووشە بەپێچەوانەوە ( 20 ووشە ) | | | | | | | |
| | | | | | | | | |
| | | | | | | | | |
| | | | | | | | | |
| | | | | | | | | |

| حەفتە و ئاست | جۆری ڕاهێنان ( 4 کاتژمێر ) | شەممە | یەکشەممە | دووشەممە | سێشەممە | چوارشەممە | پێنج شەممە | هەینی |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| حەفتەی پێنجەم / ئاستی پێنجەم | گوێگرتن لە قورئان 5جزء قاری ( أحمد بن محمد دیبان ) | | | | | | | |
| | خوێندنەوە بە چاو ( 10خولەك ) 3 جار | | | | | | | |
| | سەیرکردنی ڤیدۆی خێرا خوێندنەوە 3 جار ) | | | | | | | |
| | حفظ بصری (15) دێر (20) خولەك لەحەفتەیەك 3 ڕۆژ | | | | | | | |
| | حفظ سمعی ( 15 )دێر ( 25 ) خولەك لە حەفتەیەك 4ڕۆژ | | | | | | | |
| | ژماردن بەپێچەوانەوە ( 400 بۆ سفر ) | | | | | | | |
| | خوێندنەوەی ووشە بەپێچەوانەوە ( 20 ووشە ) | | | | | | | |
| حەفتەی شەشەم / ئاستی شەشەم | گوێگرتن لە قورئان 5جزء قاری ( أحمد بن محمد دیبان ) | | | | | | | |
| | خوێندنەوە بە چاو ( 10خولەك ) 3 جار | | | | | | | |
| | لەبەرکردنی 30 ژمارە بە (5 خوولەك ) | | | | | | | |
| | حفظ بصری (15) دێر (15) خولەك لەحەفتەیەك 3 ڕۆژ | | | | | | | |
| | حفظ سمعی ( 15 )دێر ( 20 ) خولەك لە حەفتەیەك 4ڕۆژ | | | | | | | |
| | ژماردن بەپێچەوانەوە ( 500 بۆ سفر ) | | | | | | | |
| | خوێندنەوەی پەرەیەك بەپێچەوانەوە | | | | | | | |
| حەفتەی حەوتەم / ئاستی حەوتەم | گوێگرتن لە قورئان 5جزء قاری ( أحمد بن محمد دیبان ) | | | | | | | |
| | خوێندنەوە بە چاو ( 10خولەك ) 3 جار | | | | | | | |
| | حفظ بصری (15) دێر (10) خولەك لەحەفتەیەك 3 ڕۆژ | | | | | | | |
| | حفظ سمعی ( 15 )دێر ( 15 ) خولەك لە حەفتەیەك 4ڕۆژ | | | | | | | |
| | ژماردن بەپێچەوانەوە ( 500 بۆ سفر ) | | | | | | | |
| | خوێندنەوەی ووشە بەپێچەوانەوە ( 20 ووشە ) | | | | | | | |
| | لەبەرکردنی فەرموودەیەك بەبیستن بەکەمتر لە 5جار بیستن | | | | | | | |
| حەفتەی هەشتەم/ئاستی هەشتەم | گوێگرتن لە قورئان 10 جزء قاری ( أحمد بن محمد دیبان ) | | | | | | | |
| | خوێندنەوە بە چاو ( 10خولەك ) 3 جار | | | | | | | |
| | حفظ بصری (15) دێر (5) خولەك لەحەفتەیەك 3 ڕۆژ | | | | | | | |
| | حفظ سمعی ( 15 )دێر ( 10 ) خولەك لە حەفتەیەك 4ڕۆژ | | | | | | | |
| | ژماردن بەپێچەوانەوە ( 500 بۆ سفر ) | | | | | | | |
| | خوێندنەوەی ووشە بەپێچەوانەوە ( 20 ووشە ) | | | | | | | |
| | لەبەرکردنی فەرموودەیەك بەبیستن بەکەمتر لە 3جار بیستن | | | | | | | |
| | | | | | | | | |
| | | | | | | | | |
| | | | | | | | | |

هەڵسەنگاندنی  توانای مێشك  دوای ڕاهێنانەكانت

| هەڵسەنگاندنی توانای مێشكت | ئەنجامەكەی بنووسە |
|---|---|
| 1-یەك لاپەڕەی 15 دێڕی لە سورەی بقرە بەچەند خولەك لەبەردەكەی ؟ بەبینین ( بصری ) | |
| 2- یەك لاپەڕەی دیكە بەچەند خولەك لەبەردەكەی لەسورەی بقرە بە بیستن ( سمعی ) ؟ | |
| 3- بۆ هەردێڕێك بەجەند جار دووبارەكردنەوە لەبەرتكردووە بۆ بینین و بیستن . | |
| 4- كۆی لاپەڕەكە بەچەند جار دووبارەكردنەوە لەبەرتكردوە بەبینین و بەبیستن | |
| 5- لەماوەی (10 خولەك ) تەنها بەچاو سەیركردن چەند لاپەڕەت تەماشاكردووە ؟ | |
| 5- تەنها بەیەكجار بیستن چەند ووشە لەبەردەكەیت ؟ | |
| 6- تەنها بەیەكجار بیستن چەند ژمارە لەبەردەكەیت ؟ | |

**خشتەی حفظ دوای تەواو بوونی ڕاهێنانەکان**

ئەم دوو خشتەی خوارەوە دەخەینە بەردەستت کامیان لەتواناتدایە جێبەجێی بکە

**خشتەی یەکەم /** ئەگەر بتوانیت لە ماوەی ( 5 خولەك یان 10 خولەك یان 15 خوولەك ) بەبینین ( بصری ) لاپەڕەیەك لەبەربکەی ئەوا ئەم خشتە جێبەجێ بکە .

1-ڕۆژانە یەك جزء لەبەربکە و ڕۆژانی هەینی بۆ مراجەعە بە ( 35 ) ڕۆژ حفظ قورئان دەکەی ان شاءالله.

2- ڕۆژانە ( 10 ) لاپەڕە و ڕۆژانی هەینی بۆ مراجعە بە ( 70 ) ڕۆژ حفظ قورئان دەکەیت ان شاءالله

**خشتەی دووەم /**

1- ڕۆژی شەممە بۆ چوارشەممە ( 20 ) لاپەڕە لەبەر بکە ، ڕۆژی پێنج شەممە و هەینی مراجعە ، واتە ڕۆژی (4) لاپەڕە

2- دوای ( 4) جزء هەفتەیە مراجعە ، دوای ( 8 ) جزء هەفتەیك مراجعە ، دوای ( 12 ) جزء دووهەفتە مراجعە ،

دوای (16 ) جزء سێ هەفتە مراجعە ، دوای ( 20 ) جزء دوو هەفتە مراجعە ، دوای ( 24 ) جزء سێ هەفتە ماجعە

دوای ( 30 ) جزء مانگێك مراجعە .

کەواتە بە ( 310 ) ڕۆژ = 10 مانگ تۆ دەبیتە حافظ قورئان ان شاء الله .

**تێبینی /** ئەم ڕاهێنانانە هەمان ئەو ڕاهێنانەیە کە سەرجەم سەنتەرەکانی ڕاهێنانی مێشك لەسەری دەچن ، چونکە خۆم بەشداربووە ، سوود وەرگرتنیش لەکەسێکەوە بۆ کەسێکی تر دەگۆڕێت بەشداربوو هەبوولەگەڵمان بە ( 5 یان 10 یان 15 یان 20 ) خولەك لاپەڕەیەکی لەبەردەکرد ، من خۆم پێشتر بە ( 2سعات )لاپەڕەیەکم لەبەردەکرد ، ئێستا بە 40 خولەك الحمد لله .

بۆ ڤیدۆی خێراکردنی چاو لەکاتی خوێندنەوە لە یوتوب بنووسە ( التدريبات عيون ) ڤیدۆیاتی زۆر هەیە بۆ بەهێزی چاو .

لەکۆتای دا تەنها دوعای خێرم لەئێوە دەوێت .